


حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان



# بیرکاری بۆ هەمووان



## پۆلی یەکەمی بنەڕەتی

## کتێبی قوتابی








چاپی نۆیەم
٢٠١٦ز /٢٧١٦کوردی /١٤٣٧ هـ

# ناوەڕۆك





# ناوەڕۆك







## بەشی ١ جووتبوون و ژماردن: ژمارەکان لە ١ تا ٥







## بەشی ٢ ژمارەکان لە ٦ تا ٩ پاشان سفر و دە







## بەشی ٣ ژمارەکان لە ١١ تا ٣٠







## بەشی ٤ کۆکردنەوە





## بەشی ٥ لێدەرکردن







## بەشی ٦ چەند ڕێگایەك بۆ کۆکردنەوە و لێدەرکردن





# بەشی ٧ ژمارەکان تا ٩٩





# بەشی ٨ بەراوردکردنی ژمارەکان و ڕیزکردنیان







# بەشی ٩ کۆکردنەوە و لێدەرکردن







# بەشی ١٠ پێوان و ئەندازە





# بەشی ١١ کەرتەکان و کات





# بەشی ١٢ کۆکردنەوەی دەیان و لێدەرکردنیان





# بەشی ١٣ کۆکردنەوە و لێدەکردنی دوو ژمارە








# نامەیەك بۆ كەسوكار

كەس و كاری بەڕێز.

ئەمڕۆ دەست دەكەین بە بەشی ١ فێری جووتبوونی دوو كۆمەڵ شت دەبین و هەروەها فێری ژمارەكان دەبین لە ١ تا ٥، هەر وەها چۆن دەیا نووسین وریزیاندە كەین .ئەم لاپەڕەیە هەندێ زاراوەی بیر كاری نوێ و چالاكی لەخۆ دەگرێت بەیەكەوە لەماڵەوە پێی هەڵدەستین .

لەگەڵ ڕێزدا .

________________

**زاراوە نوێیەكانم**

پتر

كەمتر

هەمان ژمارە

## زاراوەكان



كەمتر    پتر

لێرەدا چۆلەكەكان پترن لەخانوەكان

خانوەكان كەمترن لە چۆلەكەكان



هەمان ژمارە

ژمارەی هەنگەكان هەمان ژمارەی گوڵەكانە. چەند هەنگ دەبینم؟

سێ هەنگ دەبینم.

## چالاكی

- داوا لەمنداڵەكەت بكە لەگەڵتا بژمێرێت.
- لەكاتی نان خواردندا. داوا لەمنداڵەكەت بكە جووتبوون لەنێوان دوو كۆمەڵە بكات وەك كەوچكەكان و قاپەكان، بۆ ئەوەی تێبینی بكات كامیان پترەو كامیان كەمترەو كامەیان هەمان ژمارەیان هەیە.

## یەك بۆ یەك

وانەی ١


















هێڵێك ڕادەكێشم بۆ ئەوەی هەر ماسییەك بە دەفرەكەی(ئامانەكەی) بگەیەنێت.

پاكەتی هەریەك لە ئاژەڵەكان ڕەنگ دەكەم.

# ڕاهێنان دەکەم
















★ 🐢 هێڵێك دەكێشم بۆ ئەوەی هەر ماسییەك بە دەفرەكەی (ئامانەكەی) بگەیەنێت.

🐟 ❤ پاكەتی هەریەكە لە ئاژەڵەكان ڕەنگ دەكەم.

**چالاكی ماڵەوە** • كۆمەڵە شتێك ئامادە بكەو داوا لە منداڵەكەت بكە كۆمەڵەیەك پێك بهێنێ هەمان ژمارەی هەبێت.

# پتر، کەمتر

وانەی ٢














ئەو ریزە دەور دەدەم کە پتری تێدایە.

ئەو ریزە دەور دەدەم کە کەمتری تێدایە.

# ڕاهێنان دەکەم















- ئەو ریزە دەور دەدەم کە پتری تێدایە.
- ئەو ریزە دەور دەدەم کە کەمتری تێدایە.

**چالاکی ماڵەوە** • کۆمەڵە شتێك ئامادە بکەو داوا لە منداڵەکەت بکە کۆمەڵەیەك پێك بێنێت ژمارەی دانەکانی کەمتر بێت.

وانەی ٣ ________________

# بە ١، ٢، ٣ ئاشنا دەبم






١





٢



٣



٢



١

ژمارەکە دەخوێنمەوە. وێنەی چەند کڵاوێك دەکێشم یەکسان بێت بە ژمارەکە.

# ڕاهێنان دەکەم























ئۆتۆمبێلە شینەکان 

ئۆتۆمبێلە زەردەکان 

ئۆتۆمبێلە سوورەکان 

- ژمارەکە دەنووسم.
- ئەو ئۆتۆمبێلانە دەور دەدەم کە هەمان ڕەنگیان هەیە.
- ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان لە هەر ڕەنگێك دەنووسم.

 **چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە ئەو کۆمەڵانەی دوو شتی و ئەو کۆمەڵانەی سێ شتین بدۆزێتەوە.

# به ٤ و ٥ ئاشنادەبم

وانەی ٤












٣ ٤ ٥ ٣ ٤ ٥ ٣ ٤ ٥





دەژمێرم، ژمارەکە دەنووسم.

هەر کۆمەڵەیەك دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

هەر کۆمەڵەیەك دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم







٣ ٤ ٥



٣ ٤ ٥



٣ ٤ ٥













- هەر کۆمەڵەیەك دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەنووسم.
- هەر کۆمەڵەیەك دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.
- وێنەی هەناری زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٤ هەنار بەدەست بهێنم، ژمارەکە دەنووسم.
- وێنەی کۆمەڵەیەکی ٤ هەناری دەکێشم و ژمارەکە دەنووسم.

وانەی ٥

# ژمارەکان ریز دەکەم
























لە هەر ڕیزێکدا ورچەکان دەژمێرم، ژمارەکە دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم









٣ ٤









١ ٢









٢ ٣

وێنەكان دەژمێرم ئەو ژمارەیەی لە دوایەوە دێت دەنووسم .

**چالاكی ماڵەوە** • چەند كۆمەڵەیەك لە ١، ٢، ٣، ٤، ٥ پارچە پێك بهێنە لە پێنج پەرداخی بچووكدا، داوا لە منداڵەكەت بكە پەرداخەكان ڕیز بكات لە ژمارە ١ بۆ ٥.

# پرسیارێك شیكار دەكەم

## نموونەیەك پێكدێنم

وانەی ٦ ____________







چەند پەپكەیەك بەكار دەهێنم بۆ ئەوەی كۆمەڵەی پتر پێشان بدەم ،وێنەی دەكێشم و ڕەنگی دەكەم.

# ڕاهێنان دەکەم





چەند پەپکەیەك بەكار دەهێنم بۆ خستنە ڕوی کۆمەڵەی کەمتر. وێنەی دەكێشم. ڕەنگی دەکەم.

**چالاکی ماڵەوە** • کۆمەڵە شتێك لە بەردەم منداڵەکەت دابنێ داوای لێ بکە شێوەی کۆمەڵەی کەمتر پێك بهێنێ بە بەکارهێنانی شتی دی.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ١

ناو ______________




٢ ٣ ٤




٣ ٤ ٥




٢ ٣ ٤




٣ ٤ ٥




٣



٤



ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

سێوەکان دەژمێرم، ژمارەکان دەخوێنمەوە، ئەو ژمارەی لە دوایەوە دێت دەنووسم.

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ١

ناو ______________________


١
یەك






٢
دوو






٣
سێ






٤
چوار






٥
پێنج





ئەو کۆمەڵە ورچە دەور دەدەم کە ژمارەکە دەنوێنێت.




## نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز

ئەمڕۆ دەست دەكەین بە بەشی دوو ژمارەكان لە ٦ تا ٩ وە لەدوایدا سفر پاشان ١٠ دەخوێنین. بەراورد لە نێوان ئەم ژمارانە و كۆمەڵە شتەكان دەكەین. دەزانین كام كۆمەڵە پتر یان كەمتر شتی تێدایە. ئەم لاپەڕەیە هەندێ زاراوەی بیركاری نوێ وچالاكی لە خۆ دەگرێت بەیەكەوە لە ماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزدا

زاراوە نوێیەكانم

پترە لە (زیاترە لە)

كەمترە لە

## زاراوەكان



پترە لە    ٨ پترە لە ٧



كەمترە لە    ٧ كەمترە لە ٨

## چالاكی

- كۆمەڵەكان كە ٦ یان ٧ یان ٨ یان ٩ شتی تێدایە پێشكەش بە منداڵەكەت بكە. داوای لێبكە شتەكانی هەریەكەیان بژمێرێت.
- دووبارە داوای لێبكە بەراوورد لە نێوان ژمارەی شتەكانی ناو دوو كۆمەڵە بكات. پاشان پرسیاری لێبكە كام كۆمەڵە پتری تێدایە.
- دوو حەلوا بەمنداڵەكەت بدە. داوای لێبكە دانەیەكی بخوات، ئەوەی تریانت بداتێ. پرسیاری لێبكە، چەند پارچە حەلوات لاماوە.

وانەی ١

# بە ٦ و ٧ ئاشنا دەبم











٧ ٦ ٥



٧ ٦ ٥





- چۆلەکەکان لە سەرھەر چڵێك دەژمێرم و ژمارەکەی دەنووسم.
- چۆلەکەکان لە ھەر کۆمەڵەیەکدا دەژمێرم و ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.
- وێنەی ھێلکەی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٦ بەدەست بھێنم. ژمارەکە دەنووسم.
- وێنەی ھێلکەی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٧ بەدەست بھێنم. ژمارەکە دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم









٥ ٦ ٧





٥ ٦ ٧





 ٦ دەنووسم.

 وێنەی باڵندەی زیاتر دەکێشم هەتا ٧ بەدەست بێنم.

  ژمارە گونجاوەکە دەوردەدەم.

 ٧ دەنووسم.

**چالاکی ماڵەوە** • بەبیر منداڵەکەت بینەوە کە ڕۆژەکانی هەفتە ٧ ڕۆژن، بەشداری لەگەڵ بکە بۆ ناو هێنانی ڕۆژەکان، داوای لێبکە پەنجەیەکی بەرز بکاتەوە بۆ هەر ڕۆژێك ناوی دێنێت، ئەو پەنجانەی بەرزی کردۆتەوە بیانژمێرێت.

وانەی ٢

# بە ٨ و ٩ ئاشنا دەبم















پەنجەرەکانی فڕۆکەکە دەژمێرم و ٨ دەنووسم.

پەنجەرەکانی فڕۆکەکە دەژمێرم و ٩ دەنووسم.

وێنەی پەنجەرەی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٨ بەدەست بێنم.

وێنەی پەنجەرەی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٩ بەدەست بێنم.

# ڕاهێنان دەکەم



























بڵقەکان لە هەر کۆمەڵەیەکدا دەژمێرم. ژمارەکە دەنووسم.

ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

٨ دەنووسم. ٩ دەنووسم.

چالاکیماڵەوە • داوا لە منداڵەکەت بکە قاچەکانی دوو کورسی بژمێرێت. یارمەتی بدە لەسەر دۆزینەوەی کۆمەڵەیەك کە ٨ شتی تێدا دەرکەوێت.

# سفر دەناسم













٠ ٢      ٠ ٢













٠ ٣      ٠ ٣

 هێمای × لەسەر ئەو جۆلانەیە دادەنێم کە منداڵی تێدا نییە.

 ژمارەی ئەو چۆلەکانە دەور دەدەم کە لە هێلانەکەدان.

 هێمای × لەسەر ئەو هێلانانە دادەنێم کە چولەکەی تێدا نییە.

 ژمارەی پەنجەرەکان لە هەر بەلەمێك دا دەور دەدەم

# ڕاهێنان دەکەم




















ئۆتۆمبێلەکان دەژمێرم. ژمارەکە دەنووسم.

**چالاکی ماڵەوە** • لە قاپێکدا (دەفر) ٤ میوە دابنێ داوا لە منداڵەکەت بکە بیانژمێرێ. یەك میوە دەربهێنە و داوای لێبکە ئەوەی ماوە بیژمێرێ. ئەم کردارە دووبارە بکەوە هەتا قاپەکە هیچی تێدا نامێنێ. لەوە دڵنیابە کە منداڵەکەت سفر بەکاردەهێنێ.

# ١٠ دەناسم














هەنگەکان دەژمێرم ١٠ دەنووسم.

وێنەی هەنگی زیاتر دەکێشم هەتا ١٠ بەدەست بێنم.

پەپوولەکان دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەوردەدەم.

١٠ دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم



٨ ٩ ١٠





٥ ٦ ٧





٨ ٩ ١٠





٦ ٧ ٨



ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

چالاکی ماڵەوە • داوا لە منداڵەکەت بکە پەنجەکانی هەردوو دەستی بژمێرێت و ژمارەکە بنووسێت.

# ژمارەکان ڕیزدەکەم

وانەی ٥ ____________















چوارگۆشەکان دەژمێرم و ڕەنگیان دەکەم. ژمارەکانیان دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم














چوارگۆشەکان دەژمێرم و ژمارەکەیان دەنووسم.


**چالاکی ماڵەوە** • چەند پارچە میکانۆیەك یان هەرشتێکی تر ڕێك بخە ولەسەریەك دایان بنێ، کۆمەڵەی ٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١٠ی لێ پێکبهێنە. داوا لەمنداڵەکەت بکە کۆمەڵەکان ریزبکات لە کەمترەوە بۆ پتر.

# پرسیارێك شیكار دەكەم

## نموونەیەك پێكدێنم

وانەی ٦ ______________





















لە ١٠ شەش پاڵو شێوەی شەمەندەفەرێك دروستدەكەم. شەمەندەفەرەكە جیادەكەمەوە بۆ دووبەش یەكێكیان درێژتربێت لەویتر. هەردوو بەشەكە لەسەر تەختەی كار دادەنێم، وێنەی شەش پالووەكان دەكێشم ودەژمێرم لەهەر بەشێك دا وژمارەكە دەنووسم ئەو ژمارەی پتر دەنوێنێ دەوردەدەم.

# ڕاهێنان دەکەم



















شێوەی شەمەندەفەرێك لە ١٠ شەش پاڵوو دروستدەکەم. پاشان دەیکەم بەدوو بەشەوە. بەشێکیان درێژتر لەوی دی، هەردوو بەشەکە لەسەر تەختەی کار دادەنێم. شەش پالووەکان لەهەر بەشێکدا دەژمێرم و وێنەیان دەکێشم ژمارەکە دەنووسم. ئەو ژمارەیە دەوردەدەم کە پتر دەنوێنێت.

**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە دوو شێوە کۆمەڵەی یەکسان بە بەکارهێنانی ١٠ گوێز نیشان بدات. یەك گوێز لە کۆمەڵە یەکیان لابدات وبیخاتە سەر کۆمەڵەکەی تریان داوای لێبکە کۆمەڵە پترەکەیان دیاریبکات.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ٢

ناو ______________



٨ ٧ ٦



١٠ ٩ ٨



٩ ٨ ٧



٩ ٨ ٠



ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ٢

ناو ____________




خاڵەکان یەك بەدوای یەك دەگەیەنم، وێنەکە ڕەنگدەکەم.




## نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز:

ئەمڕۆ دەست دەكەین بەبەشی ٣. تیایدا ژمارەكان لە ١١ تا ٣٠ دەخوێنین. ئەو ژمارانە لەسەر (تەختەی دە) دەخەینە ڕوو. ئەم لاپەڕەیە زاراوەی بیركاری نوێی و چالاكی لە خۆدەگرێت، بەیەكەوە لەماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزدا

______________________

زاراوە نوێیەكانم

تەختەی دە

## زاراوەكان

**تەختەی دە**





١٦ **بریتییە لە دە و شەش**

تەختەی دە بەكاردەهێنرێت بۆ بنیاتنانی. وێنەیەكی هزریی بۆ دە لەلای قوتابی.




بە دەنگەوە بژمێرە، وابكە منداڵەكەت بەشداری لە ژماردنەكەدا بكات.

# کۆمەڵەکان لە دە

وانەی ١

















٨ ٩ ١٠



١٠ پەپکە لەسەر تەختەی دە، دادەنێم. ژمارەکە دەنووسم.

ئەو کۆمەڵەی لە ١٠ شت پێکهاتووە دەوردەدەم.

ئەو ژمارەیە دەوردەدەم کە گونجاوە بۆ کۆمەڵەکە.

# ڕاهێنان دەکەم





















٨ ٩ ١٠



٨ ٩ ١٠

- ❤ ئەو کۆمەڵەی لە ١٠شت پێك هاتووە دەور دەدەم.
- ★ وێنەی دانەی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ١٠ بەدەست بێنم.
- ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

**چالاکی ماڵەوە** • تەختەی دە لەسەر کاغەز وێنە بکێشە، ژمارەکان لە یەك تا دە بە شتی بچووك لەسەری بنوێنە. هەموو جارێك پرسیار لە منداڵەکەت بکە، ئایا تەختەکە کۆمەڵەیەك لە دە دەنوێنێت؟

# ژمارەکان لە ١١ تا ١٥



دە پەپکە لەسەر تەختەی دە دادەنێم
یەك پەپکە لەسەر تەختەی دووەم دادەنێم. ژمارەکە دەنووسم.
وێنەی جووچکەی زیاتر دەکێشم تا دەبێتە ١٢. ژمارەکە دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم

١٣

١٤

١٥

چوارگۆشە ڕەنگكراوەكان دەژمێرم. ژمارەكە دەنووسم.

٤ چوارگۆشەی تر ڕەنگدەکەم. ژمارەكە دەنووسم.

٥ چوارگۆشەی تر ڕەنگدەکەم. ژمارەكە دەنووسم.

١٠ چوارگۆشە ڕەنگدەكەم پاشان ٣ی دیكە. ژمارەكە دەنووسم.

١٠ چوارگۆشە ڕەنگدەكەم پاشان ٤ی دیكە. ژمارەكە دەنووسم.

١٠ چوارگۆشە ڕەنگدەكەم پاشان ٥ی دیكە. ژمارەكە دەنووسم.

**چالاكی ماڵەوە** • وێنەی دوو تەختەی دە لەسەر كاغەز بكێشە. داوا لە منداڵەكەت بكە ژمارەی ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٥ یەك لە دوای یەك ڕوونبكاتەوە بە بەكارهێنانی دوو تەختەكە و چەند شتێك وەك قۆپچەی كراس.

# ژمارەکان لە ١٦ تا ٢٠

























٦ پێنووس زیاتر لە دە وێنە دەکێشم..ژمارەکە دەنووسم.

٨ سێو زیاتر لە دە وێنە دەکێشم..ژمارەکە دەنووسم.

١٠ ماسی زیاتر لە دە وێنە دەکێشم..ژمارەکە دەنووسم

وێنەی ١٠ قۆپچە پاشان ٧ قۆپچە دەکێشم.ژمارەکە دەنووسم.

وێنەی ١٠ دڵ پاشان ٩ دڵ دەکێشم.ژمارەکە دەنووسم.

وێنەی ٢٠ کێك دەکێشم. ژمارەکە دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم





١٢ ١٣ ١٤





١٤ ١٥ ١٦





١٦ ١٧ ١٨





١٨ ١٩ ٢٠

دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم. ژمارەکە دەنووسم.


چالاکی ماڵەوە • کارتۆنێکی هێلکە ئامادە بکە دوو پارچەی لێببڕە هەر پارچەیەك (دە) شوێنی هێلکەی پێوە بێت. داوا لە منداڵەکەت بکە جاری یەکەم ژمارەی ١٦ وجاری دووەم ژمارە ١٨ دەرببڕێت بە بەکارهێنانی شتی بچووك وەك: (دەنکە نۆك).

# پرسیارێك شیكار دەكەم
## دەخەملێنم

وانەی ٤ ______











- ئەو شووشەیە دەوردەدەم کەنزیکەی ٢٠ میوەی تێدایە.
- ئەو شووشەیە دەوردەدەم کەلە ٢٠ هەڵماتی کەمتری تێدایە.

# ڕاهێنان دەکەم




























- ئەو شوشەیەی کە لە ٢٠ هەڵماتی شوشەیی کەمتری تێدایە دەور دەدەم.
- ئەو شوشەیەی کە لە ١٠ هەڵماتی شوشەیی کەمتری‌تێدایە دەور دەدەم.
- ئەو شوشەیەی کە لە ٢٠ هەڵماتی شوشەیی زیاتری تێدایە دەوردەدەم

**چالاکی ماڵەوە** • داوا لەمنداڵەکەت بکە ١٠ دەنك فاسۆلیا لەکوپێکدا دابنێ و ژمارەیەکی دیارینەکراو لە دەنك فاسۆلیا لەکوپێکی تردا دابنێ. ژمارەکەی بخەمڵێنێ پاشان داوای لێبکە ئەو دەنکە فاسۆلیانە بژمێرێت کە خەملاندوویەتی.

وانەی ٥ ______________ ژمارەکان لە ٢١ تا ٢٥

























- سەبەتەکان دەژمێرم. وێنەی سەبەتەیەکی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٢١ بەدەست بهێنم. ژمارەکە دەنووسم.
- ئاو پرژێنەکان دەژمێرم. وێنەی ٢ی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٢٢ بەدەست بهێنم. ژمارەکە دەنووسم.
- خۆرەکان دەژمێرم. وێنەی ٣ی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٢٣ بەدەست بهێنم. ژمارەکە دەنووسم.
- شەپقەکان دەژمێرم. وێنەی ٥ی زیاتر دەکێشم بۆ ئەوەی ٢٥ بەدەست بهێنم. ژمارەکە دەنووسم.

# ڕاهێنان دەکەم







٢٠ ٢١









٢٢ ٢٣









٢٤ ٢٥



ژمارەی گونجاو دەور دەدەم.

**چالاکی ماڵەوە** • داوا لەمنداڵەکەت بکە ژمارەکانی ٢١، ٢٢، ٢٣، ٢٤، ٢٥ لە لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا بناسێتەوە.

# ژمارەکان لە ٢٦ تا ٣٠

وانەی ٦ ____________







٢٧ ٢٦



















٣٠ ٢٩



- ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.
- سەوزەکان دەژمێرم، ٧ی زیاتر وێنە دەکێشم بۆ ئەوەی ٢٧ بەدەست بهێنم.
- سەوزەکان دەژمێرم، ٩ی زیاتر وێنە دەکێشم بۆ ئەوەی ٢٩ بەدەست بهێنم.
- ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

# ڕاهێنان دەکەم







٢٥ ٢٦ ٢٧









٢٦ ٢٧ ٢٨









٢٧ ٢٨ ٢٩









٢٨ ٢٩ ٣٠



ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

چالاکی ماڵەوە • ژمارەکان لە ٢١ تا ٣٠ هەریەکەیان لەسەر کارتی بچووك بە ریزکراوەیی بنووسە. هەر جارێك داوای ژمارەیەکی لێبکە لە نێوان ٢١ تا ٣٠ بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە و بیناسی و هەروەها.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ٣

ناو ______________________



١٣ ١٤



١٧ ١٨



٢٤ ٢٥



٢٧ ٢٨



٢٩ ٣٠

دەژمێرم. ژمارە گونجاوەکە دەور دەدەم.

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ٣

ناو ____________



| | |
|---|---|
| (ماسییە گەورەکە) | ____ |
| (ماسییە بچووکەکە) | ____ |

ماسییە گەورەکان دەژمێرم.ژمارەکە دەنووسم.

ماسییە بچووکەکان دەژمێرم.ژمارەکە دەنووسم.




# نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز
ئەمڕۆ دەست دەكەین بە بەشی ٤. فێری كۆكردنەوە دەبین بە هۆی چیرۆك و وێنەوە. ڕستەی كۆكردنەوە دەنووسین. ئەم لاپەڕەیە هەندێ زاراوەی بیركاری نوێ وچالاكی لە خۆ دەگرێت بە یەكەوە لە ماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزدا

________________

**زاراوە نوێیەكانم**

كۆ
سەرجەم
یەكسانە
ڕستەی كۆكردنەوە

## زاراوەكان



كۆ 
یەكسانە 

٤ + ١ = ٥

 سەرجەم

٤ + ١ = ٥ واتە ڕستەی كۆكردنەوە

## چالاكی

داوا لە منداڵەكەت بكە ڕستەیەكی كۆكردنەوە پێك بێنێت بەبەكارهێنانی كەل وپەلی ناو ماڵ، منداڵەكەت دەتوانێ دوو پێڵاو پاشان دوو پێڵاوی ترت پیشان بدات. ئەمە بە ڕستەی كۆكردنەوە دەردە بڕێت.
٢ + ٢ = ٤

# وانەی ١ ـــــــــ چەند چیرۆكێك لەسەر كۆكردنەوە

بەكاردەهێنم بۆ ئەوە چیرۆكەكە بنوێنم.
وێنەی دەكێشم ژمارەكە دەنووسم.

١




٢




٣




**باسبكە** ■ **ڕێنوێنی**

چی ڕوودەدات ئەگەر هەندێ شت بۆ كۆمەڵەیەك زیاد بكەیت؟

# ڕاهێنان دەکەم

بەکاردەهێنم بۆ ئەوە چیرۆکەکە بنوێنم.

وێنەی دەکێشم ژمارەکان دەنووسم.

١



| | | |
|---|---|---|
| ٢ | ١ | ٣ |
| دوو شێری گەورە | شێرێکی بچووک | هەمووی |

٢



| | | |
|---|---|---|
| ___ | ___ | ___ |
| ئەسپ | جوانووی ئەسپ | هەمووی |

٣



| | | |
|---|---|---|
| ___ | ___ | ___ |
| پشیلەیەکی گەورە | بەچکە پشیلە | هەمووی |



چالاکی ماڵەوە • داوا لەمنداڵەکەت بکە چیرۆکێك بڵێت لەسەر کۆکردنەوە لەهەر وێنەیەکدا.

# من کۆ دەکەمەوە

وانەی ٢




کۆدەکەمەوە. سەرجەم دەنووسم.

١



٤ + ٢ = ______

٢



٣ + ٣ = ______

٣



٢ + ٢ = ______

٤



١ + ٣ = ______

٥



٢ + ١ = ______

٦



٥ + ١ = ______

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

چۆن سەرجەمی ١ + ٤ دەدۆزیتەوە بەبێ بەکارهێنانی وێنە؟ ئەوە ڕوونبکەوە.

# ڕاهێنان دەكەم

ڕستەی كۆكردنەوە دەنووسم.

١



٢ + ٣ = ٥ قرژاڵ

٢



___ ◯ ___ ◯ ___ قرژاڵ

٣



___ ◯ ___ ◯ ___ قرژاڵ

٤



___ ◯ ___ ◯ ___ قرژاڵ

٥



___ ◯ ___ ◯ ___ ماسی

٦



___ ◯ ___ ◯ ___ ماسی

## دەنووسم

هەندێ وێنە دەكێشم چیرۆكی كۆكردنەوە ڕوونبكاتەوە.

ڕستەیەكی كۆكردنەوە بۆ ئەم چیرۆكە دەنووسم.

**چالاكیماڵەوە** • داوا لەمنداڵەكەت بكە شتی بچووك بەكار بهێنێت وەك دەنكی فاسۆلیا و قۆبچە... كە نموونە بێت بۆ چیرۆكەكانی كۆكردنەوە لەم لاپەڕەیەدا.

وانەی ٣

# سفر زیاد دەکەم



٣ + ٠ = ___٣___

سفرێك زیاد دەكەم. سەرجەم دەنووسم.

١



١ + ٠ = ______

٢



٥ + ٠ = ______

٣



٤ + ٠ = ______

٤



٦ + ٠ = ______



**باسبكە ■ ڕێنوێنی**

چ ڕوودەدات كاتێك سفر زیاد بكەین بۆ ژمارەیەك؟ بۆچی؟

# ڕاهێنان دەکەم

بۆ هەر ژمارەیەك وێنەی بازنەیەك دەکێشم. سەرجەمیش دەنووسم.

**١**

١ + ٠ = ١ | ١ + ١ = ٢ | ١ + ٢ = ٣

**٢**

٣ + ٠ = ____ | ٣ + ١ = ____ | ٣ + ٢ = ____

**٣**

٤ + ٠ = ____ | ٤ + ١ = ____ | ٤ + ٢ = ____



**پرسیارێك شیكار دەكەم** ■ ڕێنوێنی

**٤** ئەو ڕستە کۆکردنەوەیەی کە سەرجەمەکەی گەورەترین بێت دەور دەدەم، سەرجەم دەنووسم بۆ ئەوەی ساغیبکەمەوە.

٦ + ١ = ____ | ٦ + ٢ = ____ | ٦ + ٠ = ____

 **چالاکی ماڵەوە** • داوا لەمنداڵەکەت بکە ئاگادارت بکات لە کۆکردنەوەکانی ١ + ٠ تا ٦ + ٠.

وانەی ٤

# ژمارەکان پێکدێنم




و بەکار دەهێنم بۆ پێکهێنانی ٧ . ڕەنگی دەکەم. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.

١ ٦ + ١ = ٧

٢

و بەکار دەهێنم بۆ پێکهێنانی ٨. ڕەنگی دەکەم. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.

٣ ١ + ٧ = ٨

٤

و بەکار دەهێنم بۆ پێکهێنانی ٩. ڕەنگی دەکەم. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.

٥

٦

**باسبکە** ■ **ڕێنوێنی**

٣ هەیە. چەند پێویستە بۆ پێکهێنانی ٧ ؟ بۆ پێکهێنانی ٨؟ بۆ پێکهێنانی ١٠؟

و بەکاربهێنە بۆ دیارکردنی وەڵامەکەت.

# ڕاهێنان دەکەم

و بەکار دەهێنم بۆ پێکهێنانی ٨. ڕەنگی دەکەم. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.

١

٢ + ٦ = ٨

٢

و بەکار دەهێنم بۆ پێکهێنانی ١٠. ڕەنگی دەکەم. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.

٣

٤

و بەکار دەهێنم بۆ پێکهێنانی ٧. ڕەنگی دەکەم. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.

٥

٦

**پرسیارێك شیكار دەكەم** ■■ **بیرکردنەوە بەدیتن.**

ڕستەیەکی کۆکردنەوە دەنووسم کە وێنەکە دەردەبڕێت.





**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە شتی بچووك بەکاربهێنێت، وەك دەنکی فاسۆلیا، هەڵماتی شووشە... بۆ پێك هێنانی ژمارەی ٩ لە ڕێگەی چەند شێوەیەکەوە لەتوانادابێ، داوای لێبکە هەمان چالاکی دووبارە بکاتەوە بۆ ژمارەی ١٠.

## وانەی ٥ ـــــ بەستوونی و ئاسۆیی کۆدەکەمەوە

| ٣ |
| ٥ + |
| ٨ |

٣ + ٥ = ٨

هەمان ئەنجامە لە هەردوو باردا

ژمارەکان دەنووسم. سەرجەم دەنووسم.

**١**

_____ + _____ = _____

**٢**

_____ + _____ = _____

**٣**

_____ + _____ = _____

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

هەردوو کۆکردنەوەکە لەهەر ڕیزێك دا بەچی لەیەکدەچن؟ بەچی جیاوازن؟ ئەوە دیاربکە.

# ڕاهێنان دەکەم



ژمارەکان دەنووسم. سەرجەم دەنووسم.

١







+ 



٤ + ٦ = ١٠



٢







+ 



____ + ____ = ____



٣







+ 



____ + ____ = ____

## پێداچوونەوە

٤ وێنەی بازنەکان دەکێشم بۆ نواندنی هەر ژمارەیەك. سەرجەم دەنووسم.

| | | |
|---|---|---|
| ٥ + ٠ = ____ | ٥ + ١ = ____ | ٥ + ٢ = ____ |

**چالاکی ماڵەوە** • چەند پرسیارێك بۆ منداڵەکەت بنووسە لەسەر کۆکردنەوەی ستوونی و ئاسۆیی بۆ ئەوەی شیکاری بکات.

وانەی ٦ ________

# پرسیارێك شیكار دەكەم
## ڕستەی كۆكردنەوە دەنووسم

تێدەگەم | پلان دادەنێم | شیكاردەكەم | ساغدەكەمەوە

ژمارەی هەموو ماسییەكان چەندە.




**تێدەگەم**

داواكراو چییە؟

**پلان دادەنێم**

دەتوانم ڕستەی كۆكردنەوە بنووسم بۆ شیكاری پرسیارەكە.

**شیكاردەكەم**

٥ + ١ = ٦ ماسی

**ساغدەكەمەوە**

وەڵامەكەم ساغدەكەمەوە بەهۆی ژماردن.

---

ڕستەی كۆكردنەوە دەنووسم.

**١** ژمارەی هەمووی چەندە؟



___ ○ ___ ○ ___ ماسی

**٢** ژمارەی هەمووی چەندە؟



___ ○ ___ ○ ___ ماسی

**٣** ژمارەی هەمووی چەندە؟



___ ○ ___ ○ ___ ماسی

**٤** ژمارەی هەمووی چەندە؟



___ ○ ___ ○ ___ ماسی

# ڕاهێنان دەکەم

ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم. سەرجەم دەنووسم

**١**



٢ + ٤ = ٦ مۆز

**٢**



___ ◯ ___ ◯ ___ مۆز

**٣**



___ ◯ ___ ◯ ___ مۆز

**٤**



___ ◯ ___ ◯ ___ مۆز

**دەنووسم**

چەند وێنەیەك دەكێشم لەسەر چیرۆكی كۆكردنەوە بدوێت كەداتناوە.
ئەو ڕستە كۆكردنەوەیەی یارمەتی شیكارەكە دەدات دەنووسم.

**چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەكەت بكە چەند شتێكی بچووك بەكاربهێنێت بۆ نواندنی ئەو چیرۆكانەی كەلەم لاپەڕەیەدان.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ٤

ناو ______________

کۆدەکەمەوە.

**١**





٤ + ٢ = ____  ٢ + ٤ = ____  ٢ + ٣ = ____

بە دوو ڕێگە ژمارەی ٨ پێکدێنم.

**٢** ____ ◯ ____ ◯ ____

**٣** ____ ◯ ____ ◯ ____

بە دوو ڕێگە ژمارەی ١٠ پێکدێنم.

**٤** ____ ◯ ____ ◯ ____

**٥** ____ ◯ ____ ◯ ____

ئەو ژمارەیە دەنووسم کەبەرامبەر بەخاڵەکانە.سەرجەم دەنووسم.

**٦**



____ + ____ = ____



□
+ □
□

**پرسیارێك شیکاردەکەم** ■ **ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم**

**٧** ژمارەی هەمووی چەندە؟



____ ◯ ____ ◯ ____ ماسی

**٨** ژمارەی هەمووی چەندە؟



____ ◯ ____ ◯ ____ قرژاڵ

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ٤

ناو ________________

وەڵامی گونجاو هەڵدەبژێرم.

**١** کام ڕستەی کۆکردنەوە ژمارەی هەموو ماسییەکان دەنوێنێت؟



| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ + ٤ = ٥ | ٣ + ٣ = ٦ | ٣ + ٤ = ٧ | ٥ + ٣ = ٨ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

**٢** کام ڕێگا دەمانگەیەنێتە ژمارە ٨؟

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥ + ١ | ٤ + ٤ | ٦ + ٤ | ٣ + ٢ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

**٣** کام کۆکردنەوە ڕێگەیەکی تر دەنوێنێ بۆ نووسینی ٨ + ٢ = ١٠

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢ + ٦ = ٨ | ٦ + ٢ = ٨ | ٩ + ١ = ١٠ | ٨ + ٢ = ١٠ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

**٤** سەرجەمی ٧ + ٠ کامەیە؟

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٠ | ٤ | ٧ | ٨ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

**٥** هەندێ لە شەش پاڵوەکان بەسوور ڕەنگدەکەم، ئەو بەشەی دەمێنێتەوە بەشین. ڕستەی کۆکردنەوە دەنووسم.



_____ ◯ _____ ◯ _____

ڕستەی کۆکردنەوە بۆ هەمان سەرجەم دووبارە دەنووسمەوە.

_____ ◯ _____ ◯ _____

بەشی ٥

# لێدەرکردن







# نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز:

ئەمڕۆ دەست دەكەین بە بەشی ٥ هەندێ وێنەو شت بەكاردەهێنین بۆ لێدەركردن و ڕستەكانی لێدەركردن دەنووسین. ئەم لاپەڕەیە هەندێ زاراوەی بیركاری نوێ و چالاكی لە خۆدەگرێت. بەیەكەوە لەماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزم.

---

زاراوە نوێیەكانم

ڕستەی لێدەركردن
یەكسانە
كەم
جیاوازی

## زاراوەكان

ئەم وێنە و هێماو وشانە بەكاربهێنە كاتێك لەگەڵ منداڵەكەتدا ئاخاوتن لەسەر كردارەكانی لێدەركردن دەكەیت.



كەم — یەكسانە

$٣ - ٢ = ١$

جیاوازی

٣ – ٢ = ١ ڕستەی لێدەركردن




داوا لە منداڵەكەت بكە كە لەگەڵت دێت بۆ بازاڕ چەند كردارێكی لێدەركردن بكات، بۆ نموونە دەتوانیت پێی بڵێیت:
٦ سێو لە كیسێكدا دابنێ پاشان دوو سێو لە كیسەكە دەربهێنێت. چەند سێو دەمێنێتەوە؟

# وانەی ١ ـــــــــ چەند چیرۆکێك لەسەر لێدەرکردن

● بەکار دەهێنم بۆ دەربڕینی چیرۆکەکە وێنەی ● دەکێشم، پاشان ئەوەی لێیکەم کراوەتەوە دەکوژێنمەوە، ژمارەکان دەنووسم.

دوو فڕۆکە مانەوە

١




٢




٣




**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

کاتێك هەندێ شت لە کۆمەڵەیەك ڕادەکێشیت ئایا ژمارەکەی زیاد دەکات، یان کەم دەکات؟ بۆچی؟

● بەکاربهێنە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە.

# ڕاهێنان دەكەم

بەكاردەهێنم بۆ نواندنی چیرۆكەكە. دەكێشم.

پاشان ئەوەی لێیكەم كراوەتەوە دەكوژێنمەوە، ژمارەكان دەنووسم.

١




٢




٣




**چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەكەت بكە چیرۆكێكی لێدەركردن لەسەر هەر وێنەیەك بڵێت.

وانەی ٢

# من لێدەردەکەم




هەندێ وێنە دەکوژێنمەوە بۆ لێدەرکردن. جیاوازییەکە دەنووسم.

١



٤ – ٢ = ______

٢



٦ – ٣ = ______

٣



٥ – ٢ = ______

٤



٣ – ١ = ______

**باسبکە** ■ **ڕێنوێنی**

نیشانەی کەم چی دەگەیەنێت؟ نیشانەی یەکسانە چی دەگەیەنێت؟ ڕوونیبکەوە.

# ڕاهێنان دەکەم

هەندێ لە وێنەکان دەکوژێنمەوە بۆ لێدەرکردن.

ئەوەی ماوەتەوە دەینووسم.

١ 

٤ – ٣ = ١

٢ 

٦ – ٢ = ______

٣ 

٣ – ٢ = ______

٤ 

٤ – ١ = ______

٥ 

٦ – ٥ = ______

٦ 

٦ – ٤ = ______

## پێداچوونەوە

ڕستەیەکی کۆکردنەوە دەنووسم.

٧ 

______ ◯ ______ ◯ ______

٨ 

______ ◯ ______ ◯ ______

**چالاکیماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە چەند وێنەیەك بکێشێت بۆ نواندنی پرسیارێکی لێدەرکردن. پاشان داوای لێبکە ئەوەی دەمێنێتەوە دیاری بکات.

وانەی ٣

# ڕستەیەکی لێدەرکردن دەنووسم




ڕستەی لێدەرکردن دەنووسم.

١


٢


٣


٤


٥


٦





**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

چۆن ئەم ژمارانە بەکاردەهێنیت بۆ نووسینی رستەیەکی لێدەرکردن؟
ئایا دەتوانی بەم ژمارانە زیاتر لەیەك ڕستەی لێدەرکردن بنووسیت؟ ئەوە ڕوونبکەوە.

# ڕاهێنان دەکەم

ڕستەیەکی لێدەرکردن دەنووسم.

**١**



٦ ___ ١ ___ ٥

**٢**



**٣**



**٤**



**پرسیارێك شیكار دەكەم ■ بیرکردنەوە بە دیتن**

**٥** وێنەیەك دەكێشم كە كرداری لێدەرکردن روونبكاتەوە.
ڕستەی لێدەرکردنەکە دەنووسم.

**چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە هەندێ شت بەکاربهێنێ بۆ گێڕانەوەی چیرۆکێك دەربارەی لێدەرکردن و ڕستەیەکی لێدەرکردنی گونجاو بنووسێت.

## وانەی ٤ ـــــــ هەموو لێدەردەکەم یان هیچی لێدەرناکەم



٦ – ٠ = ٦

٦ – ٦ = ٠

دەکوژێنمەوە بۆ ئەوەی روونیبکەمەوە چەند چۆلەکە فڕیون،
جیاوازییەکە دەنووسم.

١ ٣ – ٠ = ______

٢ ٣ – ٣ = ______

٣ ٤ – ٤ = ______

٤ ٤ – ٠ = ______

٥ ٢ – ٠ = ______

٦ ٢ – ٢ = ______

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

چی ڕوودەدات کاتێك هەموو شتەکان لە کۆمەڵەیەك دەربکرێت؟

چی ڕوودەدات کاتێك سفر لە کۆمەڵەیەك دەربکرێت؟

# ڕاهێنان دەكەم

چەند لەو پەپوولانە فڕیون دەیانژمێرم. جیاوازییەكە دەنووسم.

١


٥ – ٥ = ٠

٢


٦ – ٠ = ٦

٣


٤ – ٤ = ____

٤


٢ – ٠ = ____

٥


٥ – ٠ = ____

٦


٦ – ٦ = ____



**پرسیارێك شیكار دەكەم ■ بیركردنەوە بەدیتن**

٧ ئەو ڕستە لێدەركردنە دەوردەدەم كە گەورەترین جیاوازی تێدایە. جیاوازییەكە دەنووسم بۆ ساغكردنەوە.

٣ – ٠ = ____  ٣ – ٢ = ____  ٣ – ٣ = ____

**چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەكەت بكە هەندێ وێنە بكێشێت بۆ ڕوونكردنەوەی دوو كرداری لێدەركردنی ٣–٣ وە ٣–٠، داوای لێبكە ئاگادارت بكات چۆن جیاوازییەكەی دەرهێناوە لە هەر بارێكدا.

# وانەی ٥ ـــــــــــ لە میانەی ١٠ لێدەرکردن دەکەم




٧ – ٠ = ٧




٧ – ١ = ٦



■ بەکاردەهێنم بۆ دۆزینەوەی جیاوازی.

| | |
|---|---|
| ١ ٧ – ٣ = ٤ | ٢ ٧ – ٢ = ____ |
| ٣ ٧ – ١ = ____ | ٤ ٧ – ٠ = ____ |
| ٥ ٧ – ٥ = ____ | ٦ ٧ – ٧ = ____ |
| ٧ ٨ – ٠ = ____ | ٨ ٨ – ٢ = ____ |




**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

شێوازەکە تەواو بکە، ئەو ڕستەی لێدەرکردنە کامەیە کە لە دوای دێت، ئەوە ڕوونبکەوە.

# ڕاهێنان دەکەم




بەکاردەهێنم بۆ دۆزینەوەی جیاوازی.

١   ٩ – ٠ = ٩

| | |
|---|---|
| ٢   ٩ – ١ = ______ | ٣   ٩ – ٣ = ______ |
| ٤   ٩ – ٥ = ______ | ٥   ٩ – ٩ = ______ |
| ٦   ١٠ – ٥ = ______ | ٧   ١٠ – ٧ = ______ |
| ٨   ١٠ – ٨ = ______ | ٩   ١٠ – ٩ = ______ |

**دەنووسم**

چەند ڕستەی لێدەرکردن لە ١٠ دەتوانم بنووسم.

ڕوونی دەکەمەوە.

**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە چەند شتێکی بچووک بەکاربهێنێت کە هەموو جۆرە کردارەکانی لێدەرکردن لە ١٠ پیشان بدات.

# پرسیارێك شیكار دەكەم
## نموونەیەك پێكدێنم

وانەی ٦ ________

تێدەگەم | پلان دادەنێم | شیكاردەكەم | ساغدەكەمەوە



٣ پەپوولە لەسەر ڕووەكێكن. یەكێكیان فڕی
چەند پەپوولە مایەوە؟

**تێدەگەم**

داواكراو چییە؟

**پلان دادەنێم**

نمونەیەك دروست دەكەم بۆ شیكاری پرسیارەكە.

**شیكاردەكەم**



بە ٣ دەست پێ دەكەم.
یەك دەكوژێنمەوە.
٢ دەمێنێتەوە.

دوو پەپوولە دەمێنێتەوە.

**ساغدەكەمەوە**

ئایا وەڵامەكەم شیاوە؟ ئەوە ڕووندەكەمەوە.

بەكاردەهێنم بۆ ئەوەی كۆبكەمەوە یان لێدەربكەم.
وێنەی دەكێشم سەرجەم یان جیاوازی دەنووسم.

١ ٤ كوللە لەسەر بەردێكن. دوو كوللە هاتن
بۆلایان، بوون بە چەند؟



________ كوللە

٢ ٥ كیسەڵ لە لێواری ڕووبارێك دەڕۆن.
٢ یان ڕاوەستان، چەن كیسەڵ بەردەوامن
لە ڕۆیشتن؟



________ كیسەڵ.

# ڕاهێنان دەکەم

● بەکاردەهێنم بۆ ئەوەی کۆبکەمەوە یان لێدەربکەم.
وێنەی ● دەکێشم سەرجەم یان جیاوازی دەنووسم.

**١** شیلان ٤ بۆقی دی
٣ یان ڕۆیشتن، چەند
بۆق مایەوە؟

_____ بۆق

**٢** لە پێش نیوەڕۆ دانا ٣ مراوی بینی،
لەپاش نیوڕۆ ٣ مراوی بینی مەلە
دەکەن، ئەو ڕۆژە دانا چەند مراوی
بینیوە؟

_____ مراوی

**٣** شارا ٥ ماسی ڕاوکرد، ٢ یان کەوتنەوە
ئاوەکەوە، چەند ماسی لاماوە؟

_____ ماسی

**دەنووسم**

چیرۆکێکی لێدەرکردن بۆ ئەم
وێنەیە بنووسە.
ڕستەی لێدەرکردنەکە بنووسە.

**چالاکی ماڵەوە** • چەند چیرۆکێکی هاوشێوەی چیرۆکەکانی ئەم وانەیە دارێژە، داوا لە منداڵەکەت بکە شیکاری بکات بە بەکارهێنانی هەندێ شت کە پرسیارەکان بنوێنێت.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ٥

ناو ______________

رستەی لێدەرکردنەکە دەنووسم.

١



_____ ◯ _____ ◯ _____

٢



_____ ◯ _____ ◯ _____

جیاوازی دەنووسم.

٣



٥ − ٠ = _____

٤



٦ − ٦ = _____

ڕستەیەکی لێدەرکردن لە ٨ دەنووسم.

٥ ٨ − _____ = _____

٦ ٨ − _____ = _____

جیاوازی دەنووسم.

٧ ٦ − ٤ = _____

٨ ٧ − ٢ = _____

**پرسیارێك شیکاردەکەم ■ بیرکردنەوە بەدیتن**

● بەکاردەهێنم بۆ ئەوەی کۆبکەمەوە یان لێدەربکەم.

وێنەی ● دەکێشم سەرجەم یان جیاوازی دەنووسم.

٩ لەسەر چیلکەدارێك ٦ مێرووله هەیە، ٣ یان ڕۆیشتن، چەند مێرووله لەسەر چیلکەدارەکە ماونەتەوە؟



_____ مێرووله

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ٥

ناو ______________

وەڵامی گونجاو هەڵدەبژێرم.

**١** کام ڕستەی لێدەرکردن ئەم وێنەیە دەنوێنێ؟



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦ – ٦ = ٠ | ٦ – ٣ = ٣ | ٦ – ٤ = ٢ | ٦ – ١ = ٥ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

---

**٢** ٨ – ٢

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢ | ١١ | ٦ | ٥ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

**٣** ٩ – ٢

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦ | ٧ | ١٢ | ١٣ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

---

**٤** لەسەر دارێك ٥ چۆلەکە هەیە. دووانیان فڕین، چەند چۆلەکە لەسەر دارەکە ماونەتەوە؟

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٠ | ١ | ٣ | ٥ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

---

**٥** جیاوازی چەندە؟

٨ – ٣ = ______



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥ | ٦ | ٨ | ١١ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

---

**٦** کامیان لەمانەی خوارەوە ڕێگایەکی ترە بۆ نووسینی ٦–٢=٤ ؟

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨ | ٨ | ٤ | ٦ |
| –٢ | –٦ | –٢ | –٢ |
| ٦ | ٢ | ٢ | ٤ |
| ○ | ○ | ○ | ○ |

## بەشی ٦

# چەند ڕێگایەك بۆ کۆکردنەوە و لێدەرکردن







## نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز

ئەمڕۆ دەست دەكەین بە بەشی ٦. فێردەبین چۆن بەرەوپێش دەژمێرین،
دوو ئەوەندە دەناسین كە هەندێ جار یارمەتیمان دەدات بۆ دۆزینەوەی
سەرجەم فێردەبین چۆن بەرەو پاش دەژمێرین، چۆن هێلی ژمارەكان
بەكاردەهێنین بۆ دۆزینەوەی جیاوازی نێوان دوو ژمارە.
ئەم لاپەڕەیە هەندێ زاراوەی بیركاری نوێ وچالاكی
لە خۆ دەگرێت بەیەكەوە لە ماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزدا.

**زاراوە نوێیەكانم**

دوو ئەوەندە
ژماردن بەرەوپێش
ژماردن بەرەو پاش
هێڵی ژمارەكان.

## زاراوەكان

**دوو ئەوەندە** سەرجەمی دوو ژمارەی یەكسان.

٤ + ٤ = ٨     ٨ **دوو ئەوەندەی** ژمارەی (٤)ە

**ژماردن بەرەو پێش** ڕێگایەكە بۆ كۆكردنەوە.بۆ ئەوەی ٦، ٢ كۆ بكەیتەوە لە ژمارە گەورەكەی ٦ دەستپێبكە پاشان بەرەو پێش دووجار بژمێرە:٧، ٨.

٦+ ٢ = ٨

**ژماردن بەرەو پاش** ڕێگایەك بۆ لێدەركردن.

ژماردن بەرەو پاش بەكار دەهێنین بەدەستپێكردنی بە ژمارە گەورەكە. ٥ – ٢ = ٣

بە ٥ دەست پێ دەكەم پاشان
٢ دەژمێرم بەرەوپاش ٤، ٣

**هێڵی ژمارەكان** بەكاردەهێنم بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات لەسەر هێڵی ژمارەكان بەرەوپاش بژمێرین.




## چالاكی

چەند پرسیارێك دابڕێژە.كۆكردنەوەی تێدا بێت. ئەو شتانە بەكاربهێنە كە لە ژیانی ڕۆژانەدا لە ماڵەوە یان لە شوێنی تر دەیبینیت.

دوو كۆمەڵە شتی یەكسان لە پێش خۆت دابنێ بە مەرجێك یەكێك لەو كۆمەڵانە لە یەك تا چوار شتی تێدابێ.

هاریكاری منداڵەكەت بكە بۆ ناسینی دوو ئەوەندە. داوای لێبكە سەرجەمەكەت بداتێ.

هەروەها كۆمەڵەیەك لە ١٠ دەنكە بادەم یان مێوژ پێشكەش بە منداڵەكەت بكە داوای لێبكە كە دەنك دوای دەنك بیخوات لەهەر جارێكدا ڕستەی لێدەركردنی گونجاو بنوسێت.

# وانەی ١ بەرەو پێش دەژمێرم




بەکار دەهێنم. بەرەوپێش دەژمێرم. سەرجەم دەنووسم.

١




٥ + ١ = ______

٢




٨ + ١ = ______

٣




٤ + ٢ = ______

٤




٨ + ٢ = ______

٥




٦ + ١ = ______

٦




٧ + ٢ = ______

**باسبکە** ■ **ڕێنوێنی**

چۆن بەرەو پێش دەژمێری بۆ دۆزینەوەی سەرجەمی ٦ + ٢ = ؟

ئایا بەلاتەوە گرنگە بەکام ژمارە دەست پێ بکەیت؟



# ڕاهێنان دەکەم

بەرەو پێش دەژمێرم. سەرجەم دەنووسم.

١



٧ + ٣ = ______

٢



٦ + ٢ = ______

٣



٥ + ٢ = ______

٤



٨ + ١ = ______

٥ ٩ + ١ = ______ ٨ + ٢ = ______ ٦ + ٣ = ______

٦ ٧ + ٢ = ______ ٥ + ٣ = ______ ٣ + ٣ = ______

ڕستەی کۆکردنەوە تەواو دەکەم.

٧


سەرجەم ٨

٦ + ______ = ٨

٨


سەرجەم ٧

٦ + ______ = ٧

**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە شتەکان بژمێرێت لە کۆمەڵەیەکدا.ژمارەی دانەکانی لە ٨ کەمتر بێت. پاشان داوای لێبکە بەرەو پێش بژمێرێت بە زیاد کردنی ٣.

## وانەی ٢ ـــــــــــ دوو ئەوەندە ئەنجام دەدەم




بە کاردەهێنم.

ڕستەیەکی کۆکردنەوە دەنووسم.

١ ـــــ ◯ ـــــ ◯ ـــــ

٢ ـــــ ◯ ـــــ ◯ ـــــ

٣ ـــــ ◯ ـــــ ◯ ـــــ

٤ ـــــ ◯ ـــــ ◯ ـــــ

**باسبکە** ■ **ڕێنوێنی**

کام ژمارە لەم ژمارانە دوو ئەوەندە نییە؟ دیاریبکە.



# ڕاهێنان دەکەم



٥
٥ +
١٠

لە کویێ دوو ئەوەندە ببینم دەوری دەدەم.پاشان کۆی دەکەمەوە.

**١**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥ | ١ | ٢ | ١ |
| ٣ + | ١ + | ٢ + | ٠ + |

**٢**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤ | ٦ | ٩ | ٧ |
| ٤ + | ١ + | ١ + | ٣ + |

**٣**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥ | ٨ | ٧ | ٣ |
| ٥ + | ٢ + | ٢ + | ٣ + |

**پرسیارێك شیكار دەكەم ■ بیرکردنەوە بە دیتن**

ڕستەیەکی کۆکردنەوە دەنووسم دوو ئەوەندەی تێدا دیار دەکەم.

**٤**







**٥**







**چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە ژمارەیەك هەڵبژێرێت لە نێوان ١، ٥ و بەکاری بهێنێت بۆ نووسینی ڕستەی کۆکردنەوەکە دوو ئەوەندەی تێدادیاربکات.

وانەی ٣

# لە میانەی ١٠ کۆ دەکەمەوە



٥
٣ +
٨



٣
٥ +
٨



کۆدەکەمەوە. ریزەکە دەگۆڕم، پاشان کرداری کۆکردنەوەی نوێ دەنووسم.

**١**

٥ + ٢ = ☐ + ☐ = ☐

٤ + ٣ = ☐ + ☐ = ☐

١ + ٧ = ☐ + ☐ = ☐

**٢**

٦ + ٢ = ☐ + ☐ = ☐

٧ + ٠ = ☐ + ☐ = ☐

١ + ٥ = ☐ + ☐ = ☐

**٣**

٠ + ٢ = ☐ + ☐ = ☐

٢ + ٣ = ☐ + ☐ = ☐

٤ + ٢ = ☐ + ☐ = ☐

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

سەرجەمی دوو ژمارە چی بەسەر دێت ئەگەر ڕێزبەندییەکەیان بگۆڕین؟

# ڕاهێنان دەکەم

کۆ دەکەمەوە. سەرجەم دەنووسم.

١ ٩ + ٠ ‏ ‏ ٠ + ٩

٢ ٩ + ١ ‏ ‏ ١ + ٩

٣ ٧ + ٢ ‏ ‏ ٢ + ٧

٤ ٨ + ١ ‏ ‏ ١ + ٨

٥ ٦ + ٢ ‏ ‏ ٢ + ٦

٦ ٣ + ٥ ‏ ‏ ٥ + ٣

٧ ٥ + ٢ ‏ ‏ ٢ + ٥

٨ ٨ + ٢ ‏ ‏ ٢ + ٨

٩ ١ + ٧ ‏ ‏ ٧ + ١

## پێداچوونەوە

هەموو ڕستەکانی کۆکردنەوە دەنووسم کە ٥ بەدەست دەهێنن.

١٠ ______ + ______ = ٥

١١ ______ + ______ = ٥

١٢ ______ + ______ = ٥

١٣ ______ + ______ = ٥

١٤ ______ + ______ = ٥

١٥ ______ + ______ = ٥

**چالاکی ماڵەوە** • ژمارەیەك لە نێوان ١ و ١٠ هەڵبژێرە، پاشان داوا لە منداڵەکەت بکە کردارێکی کۆکردنەوەت بداتێ سەرجەمەکەی یەکسان بێت بەو ژمارەی هەڵتبژاردووە. ئەم چالاکییە دووبارە بکەوە لەگەڵ ژمارەیەکی دی.

# بەرەو پاش دەژمێرم

وانەی ٤




بە ٤ دەستپێدەکەم لەسەر هێڵی ژمارەکان بە ١ بەرەو پاش دەژمێرم. من ئێستا لە کوێم؟

٤ – ١ = ٣




بە ٤ دەستپێدەکەم لەسەر هێڵی ژمارەکان بە ٢ بەرەو پاش دەژمێرم. من ئێستا لە کوێم؟

٤ – ٢ = ٢

هێڵی ژمارەکان بەکار دەهێنم وبەرەوپاش دەژمێرم بۆ ئەوەی لێدەربکەم.

١




٢ – ٢ = ______

٢




٣ – ١ = ______

٣




٣ – ٢ = ______

٤




٥ – ٢ = ______

٥




١٠ – ١ = ______

٦




٨ – ٢ = ______



**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

بۆ چی بەرەو چەپ دەجولێیت کاتێك هێڵی ژمارەکان بەکاردێنیت بۆ لێدەرکردن.

# ڕاهێنان دەکەم

هێڵی ژمارەکان بەکاردەهێنم بەرەو پاش دەژمێرم بۆ ئەوەی لێدەربکەم.

**١**



٧ – ٣ = ٤

**٢**



٨ – ٣ = ______

**٣**



٥ – ١ = ______

**٤**



١٠ – ٢ = ______

**٥**



٥ – ٥ = ______

**٦**



٩ – ٣ = ______



**پرسیارێك شیكار دەكەم ■ جێبەجێكردن**

ڕستە یەكی ژمارەیی دەنووسم، هێڵی ژمارەكان بەكاردەهێنم بۆ شیكاركردن

**٧** لەوێدا ٧ چۆلەكە هەیە دووانیان فڕین .
چەند چۆلەكە مانەوە؟



______ ◯ ______ ◯ ______ چۆلەكە

**چالاكی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەكەت بكە بۆت دیاربكات چۆن ژماردن بەرەو پاش بەكار دەهێنیت بۆ دیتنەوەی جیاوازی ٩–٣

## وانەی ٥ — کۆکردنەوە و لێدەرکردن پێکەوە دەبەستم

هەردوو کرداری کۆکردنەوە و لێدەرکردن دوو راستین هەر یەکەیان بەوی تریانەوە بەستراوە







١٠ − ٣ = ٧

٧ + ٣ = ١٠



■ و ■ بەکار دەهێنم بۆ ئەوەی کۆکردنەوە و لێدەرکردن بکەم. خشتەکە تەواو دەکەم

| | لامە ■ | زیاد دەکەم ■ | سەرجەم دەنووسم | لێ وەردەگرم | جیاوازی دەنووسم |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٤ | ٢ | ٤ + ٢ = ______ | ٢ | ٦ − ٢ = ______ |
| ٢ | ٥ | ٣ | ٥ + ٣ = ______ | ٣ | ٨ − ٣ = ______ |
| ٣ | ٢ | ٥ | ٢ + ٥ = ______ | ٥ | ٧ − ٥ = ______ |
| ٤ | ٧ | ٢ | ٧ + ٢ = ______ | ٢ | ٩ − ٢ = ______ |
| ٥ | ٨ | ٠ | ٨ + ٠ = ______ | ٠ | ٨ − ٠ = ______ |

**باسبکە** ■ **ڕێنوێنی**

ڕستەی کۆکردنەوەی ٦ + ٣ = ٩ و ڕستەی لێدەرکردنی ٩ − ٣ = ٦ بە چی لە یەکدەچن؟ و بە چی جیاوازن؟ بۆچی دەڵێن یەکتربەستن لە نێوانیان دا هەیە؟

# ڕاهێنان دەکەم



کۆدەکەمەوە پاشان لێدەردەکەم

١



٥ + ٤ = ٩ ______

٩ − ٤ = ٥ ______

٢



٧ + ١ = ______

٨ − ١ = ______

٣



٤ + ٣ = ______

٧ − ٣ = ______

٤

٨ + ١ = ______

٩ − ١ = ______

٥

٤ + ٤ = ______

٨ − ٤ = ______

٦

٦ + ٤ = ______

١٠ − ٤ = ______



**پرسیارێك شیكار دەكەم ■ جێبەجێكردن**

شیكار دەكەم. پاشان ڕستەی كۆكردنەوە، یان ڕستەی لێدەركردنی گونجاو دەنووسم.

٧ لەسەر ڕەفەیەك ٥ كتێب هەیە، بڵند ٣ كتێبی تری لەسەر دانا. بوونە چەند كتێب لەسەر ڕەفەكە؟

______ ◯ ______ ◯ ______

٨ لەسەر دارێك ٨ چۆلەكە هەیە، ٣ چۆلەكەیان فڕین ،چەند چۆلەكە لەسەر دارەكە ماوەتەوە؟

______ ◯ ______ ◯ ______

**چالاكی ماڵەوە** ● داوا لە منداڵەكەت بكە ١٠ شتی بچووك بەكاربهێنێ بۆ شیكار كردنی پرسیارێكی كۆكردنەوە. داوای لێبكە ڕستەی كۆكردنەوە و ڕستەی لێدەركردن بنوسێت كە پەیوەندی پێوە هەبێت.

# وانەی ٦ ــــــ ڕاستییە پێکەوە بەستراوەکانی لێدەرکردن




لێدەردەکەم ئەو دوو ڕستەیە دەورە دەدەم کە هەمان ژمارەیان تیدا دەردەکەوێت.

**١** ٧ – ٥ = ٢

٧ – ٢ = ٥

**٢** ٤ – ٣ = ______

٤ – ١ = ______

**٣** ٥ – ٥ = ______

٥ – ٠ = ______

**٤** ٧ – ٤ = ______

٧ – ٣ = ______

**٥** ٩ – ١ = ______ ، ٩ – ٨ = ______

**٦** ٧ – ٧ = ______ ، ٧ – ٠ = ______

**٧** ٨ – ٦ = ______ ، ٨ – ٢ = ______

**٨** ٨ – ٣ = ______ ، ٨ – ٥ = ______

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

چەند ڕستەی لێدەرکردن دەتوانی بنووسیت ئەگەر ژمارەکانی ٢ و ٣ و٥ بەکار بهێنیت.ڕوونیبکەوە.

# ڕاهێنان دەکەم

٤ شین ٥ زەرد ٦ سوور ٧ سەوز

لێدەردەکەم پاشان هەر بەشێك بەڕەنگێکی گونجاو بۆ جیاوازییەکە ڕەنگدەکەم




**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە ڕستەکانی لێدەرکردن لە ٨ – ٠ تا ٨ – ٨ بنووسێت.

# پرسیارێك شیكار دەكەم
## كرداری گونجاو هەڵدەبژێرم

وانەی ٧

تێدەگەم | پلان دادەنێم | شیكاردەكەم | ساغدەكەمەوە

وشەی **كۆكردنەوە** یان **لێدەركردن** دەورە دەدەم. كرداری ژماردن دەنووسم.



سێوەكان كەم بوونەوە پێویستە لێدەركەم




١ شیرین ١٠ سێوی لایە، ٤ سێوی دایە ڕێڤینی برای چەند سێوی لاماوە؟

٢ ٧ پارچە شیرینیمان هەیە. كلارا ٤ پارچەی خوارد. چەند پارچە شیرینی ماوە؟



_____ پارچە شیرینی




٣ لەسەر سفرەكە ٣ چەتاڵ هەیە. شنە ٤ چەتاڵی هێنا، هەموو بوو بە چەند ؟



_____ چەتاڵ




٤ سالار ٩ گێزەری دابە كەروێشكەكەی. كەروێشكەكە ٥ گێزەری خوارد. چەند گێزەر ماوەتەوە؟



_____ گێزەر



# ڕاهێنان دەكەم



كۆدەكەمەوە یان لێدەردەكەم

**١** لەسەر مێزێك ٥ پارچە شیرینی هەیە .
ڕەڤەند ٢ پارچەی تری ئامادە كرد .
ژمارەی پارچەكان چەندە ؟

٧ پارچە



كۆدەكەمەوە    لێدەردەكەم

٥ + ٢ = ٧

**٢** لە ویدا ٦ سێو هەیە .
تۆ و باوكت ٢ سێوتان خوارد .
چەند سێو ماوەتەوە ؟

____ سێو



كۆدەكەمەوە    لێدەردەكەم

____ ◯ ____ ◯ ____

**٣** لەبەردەم بلّند دا ٧ كووپ هەیە .
٣ كووپی تری ئامادە كرد .
ژمارەی كووپەكان چەندە ؟

____ كووپ



كۆدەكەمەوە    لێدەردەكەم

____ ◯ ____ ◯ ____

**٤** لەدەفرێكدا ٨ سەندەویچ هەیە .
مێوانەكان ٣ سەندەویچیان خوارد.
چەند ماوەتەوە ؟

____ سەندەویچ

كۆدەكەمەوە    لێدەردەكەم

____ ◯ ____ ◯ ____



**بنووسە.**

چیرۆكی كۆكردنەوە یان لێدەركردن دەگێرمەوە.

كرداره ژمارەییەكەی دەنووسم . وێنەیەك دەكێشم بۆ ساغكردنەوە.

**چالاكی ماڵەوە** • پرسیار لە منداڵەكەت بكە چۆن كردارەكە هەڵدەبژێرێت لە هەر پرسیارێكی ئەم لاپەڕەیە.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ٦

ناو ________________

لێدەردەکەم پاشان دەوری هەردوو کرداره‌که دەدەم کەهەمان ژمارەکانی تێدایە.

١ ٩ − ٥ = ______

٩ − ٤ = ______

٢ ١٠ − ٨ = ______

١٠ − ٢ = ______

هێڵی ژمارەکان بەکار دەهێنم ،وبەرەوپاش دەژمێرم بۆ ئەوەی لێدەربکەم.

٣




٧ − ١ = ______

١٠ − ٢ = ______

لەکوێ دوو ئەوەندە ببینم دەورەی دەدەم. کۆدەکەمەوە و سەرجەم دەنووسم.

٤

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٩ | ٢ | ٤ | ٧ | ٦ | ٢ |
| + ١ | + ٥ | + ٤ | + ٢ | + ٣ | + ٤ |

بەرەو پێش دەژمێرم. سەرجەم دەنووسم.

٥




٨ + ١ = _____

٦




٧ + ٣ = _____

**پرسیارێك شیکار دەکەم.**

وشەی **کۆدەکەمەوە** یان **لێدەردەکەم** دەورە دەدەم ڕستەیەکی ژمارەیی دەنووسم.

٧ لەوێدا ١٠ گۆزە هەنگوین هەیە ٣ یان شکا. چەند گۆزە ماوەتەوە؟




کۆدەکەمەوە لێدەردەکەم

______ ◯ ______ = ______

______ گۆزە

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ٦

ناو ______________

وەڵامی گونجاو هەڵدەبژێرم.

١ ‏ ١٠ − ١

٩ ○ ‏ ١٠ ○ ‏ ١١ ○ ‏ ١٢ ○

٢ ‏ ٥ + ٤

٦ ○ ‏ ٧ ○ ‏ ٨ ○ ‏ ٩ ○

٣ هێڵی ژمارەکان چی دەنوێنێ.




٥ − ٣ ○ ‏ ٥ − ٢ ○ ‏ ٣ + ٢ ○ ‏ ٢ + ٣ ○

٤ نیڤین ٩ گوێزی لایە، ٣ گوێزی شکاند و خواردی.چەند گوێزی لاماوە؟

١٢ ○ ‏ ٩ ○ ‏ ٧ ○ ‏ ٦ ○

٥ لە قاپێکدا ٣ مۆز هەیە ٢مۆزی ترمان بۆ زیادکرد .
کام ڕستە لەمانەی خوارەوە ژمارەی مۆزەکانی ناوقاپەکە دەگەیەنی؟

٣ − ٢ = ١ ○ ‏ ٣ − ٣ = ٠ ○ ‏ ٣ + ٢ = ٥ ○ ‏ ٢ + ٢ = ٤ ○

٦ بەکاربینە. چوار ڕستەی ژمارەیی بنووسە هەمان ژمارەی تێدابێ.

____ ○ ____ ○ ____ ‏ ‏ ____ ○ ____ ○ ____

____ ○ ____ ○ ____ ‏ ‏ ____ ○ ____ ○ ____

بەشی ٧

# ژمارەکان تا ٩٩



خاڵەکان دەژمێرم لە هەر ستوونی چەند ستوون دەبینم ؟ ژمارەی هەموو خاڵەکان چەندە؟




# نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز

ئەمڕۆ دەست دەكەین بە بەشی ٧. فێری ژمارەكان تا ٩٩ دەبین، ژماردن و نووسین وخوێندنەوەیان. دەیان فێردەبین ژمارەكان جیادەكەینەوە بۆ یەكان ودەیان. ئەم لاپەڕەیە بەهەندێ زاراوەی بیركاری نوێ و چالاكی لە خۆدەگرێت پێكەوە لە ماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزمدا

______________________

زاراوە نوێیەكانم

دەیان

یەكان

# زاراوەكان

| دەیان | یەكان |
| --- | --- |
| ▮▮▮ | ▪▪▪▪▪ |

٥ **یەكی** و ٣ **دەیی** = ٣٥

سی و پێنج



٩ دەیی = نەوەد




كاغەزێك لە ناوەراستدا بنوشتێنەوە لە نیوەی لای چەپ دەیانی لەسەری نیشان بكە، لە نیوەی لای ڕاستیدا یەكان نیشان بكە .كۆمەڵی شتی بچووكی وەك دەنكی فاسۆلیا بۆ نموونە بدە بە منداڵەكەت، داخوازی لێبكە بەپێی توانا كۆمەڵە شتەكان لە دە كۆ بكاتەوە لە نیوەی لای چەپی كاغەزەكەدا دابنێ پاشان داوای لێبكە (یەكانی) ماوە لە نیوەی لای ڕاست دابنێ لە كۆتایی دا داوای لێبكە ژمارەكان بنووسێ.

# دەیان

وانەی ١

دەتوانیت شتەکانی ناو کۆمەلە دەیەکان کۆبکەیتەوە و دە دە بیانژمێری بۆ ئەوەی ژمارەکەیان بدۆزیتەوە



١٠ = یەك دە

بەکار دەهێنم بۆ ئەوەی دەیان کۆبکەمەوە. وێنەی دەیەکان دەکێشم. بە دە دە دەژمێرم وژمارەکە دەنووسم.

١ دوو دەیی کۆدەکەمەوە.



٢٠

بیست

٢ سێ دەیی کۆدەکەمەوە.

سی

٣ پێنج دەیی کۆدەکەمەوە.

پەنجا

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

لە ٨٠ دا چەند دەیی هەیە؟ چۆن ئەوە دەزانی؟

# ڕاهێنان دەکەم



ژمارەی دەیان دەنووسم، دەدە دەژمێرم .

هەموو ژمارەکە دەنووسم.

١ 

| | |
|---|---|
| ٣ | ٣٠ |
| دەیی | سی |

٢ 

| | |
|---|---|
| ____ | ____ |
| دەیی | نەوەد |

٣ 

| | |
|---|---|
| ____ | ____ |
| دەیی | حەفتا |

٤ 

| | |
|---|---|
| ____ | ____ |
| دەیی | چل |

٥ 

| | |
|---|---|
| ____ | ____ |
| دەیی | شەست |

 چالاکی ماڵەوە • داوا لە منداڵەکەت بکە شتەکان بە دەیان کۆبکاتەوە ،و ژمارەکەشت بداتێ.

# یەکان و دەیان

وانەی ٢




| دەیان | یەکان |
|---|---|
| | |

٠ یەکی ١ دەیی = ١٠




| دەیان | یەکان |
|---|---|
| | |

١ یەکی ١ دەیی = ١١



نیشانە لەسەر کۆمەڵەی دە و لەسەر یەکان دەکەم ڕەنووسی یەکان و ڕەنووسی دەیان دەنووسم، ژمارەکە دەنووسم.

١ ٨ یەکی ١ دەیی = ١٨

٢ ____ یەکی ____ دەیی = ____

٣ ____ یەکی ____ دەیی = ____

٤ ____ یەکی ____ دەیی = ____

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

ئەم دوو ژمارە بەچی لەیەك دەچن ؟بەچی جیاوازن؟

■ بەکاردەهێنم بۆ دیاریکردنی وەڵامەکە .



# ڕاهێنان دەکەم



ڕەنووسی یەکان و دەیان دەنووسم، ژمارەکە دەنووسم .

١



٠ یەکی ٢ دەیی = ٢٠

٢



______ یەکی ______ دەیی = ______

٣



______ یەکی ______ دەیی = ______

٤



______ یەکی ______ دەیی = ______



پرسیارێك شیکار دەکەم ■ واتای ژمارە .

من کام ژمارەم ؟

٥ من ژمارەیەکم لە ١٠ پترو لە ٢٠ بچووکتر، ڕەنووسی یەکانم یەکسانە بە ڕەنووسی دەیانم من کام ژمارەم ؟ ______

چالاکی ماڵەوە • داوا لە منداڵەکەت بکە شتێکی بچووك بەکار بێنێت بۆ نواندنی ژمارەکان لە نێوان ١٠ و ٢٠ داوای لێبکە کۆمەڵەی یەکان ودەیان پێکبهێنێت وداوای لێبکە ڕەنووسی یەکان و ڕەنووسی دەیانت بداتێ لەگەڵ ژمارەی دەستکەوت.

# ژمارەکان تا ٩٩













٤ یەکی ٢ دەیی = ٢٤

٢ یەکی ٤ دەیی = ٤٢



نیشانە لەسەر کۆمەڵەکانی دە و نیشانە لەسەر یەکان دەکەم، ڕەنووسی یەکان و ڕەنووسی دەیان دەنووسم . ژمارەکە بە تەواوی دەنووسم .

**١**



١ یەکی ٥ دەیی = ٥١

**٢**



______ یەکی ______ دەیی = ______

**٣**



______ یەکی ______ دەیی = ______

**٤**



______ یەکی ______ دەیی = ______

**باسبکە ■ ڕێنوێنی**

سفر لە ژمارەی ٣٠ دا چی دەگەیێنێ ؟

بەکاردەهێنم بۆ ڕوونکردنەوەی وەڵام .





# ڕاهێنان دەکەم

ڕەنووسی یەکان و ڕەنووسی دەیان دەنووسم، ژمارەکە دەنووسم .

١


١ یەکی ٦ دەیی = ٦١

٢


______ یەکی ______ دەیی = ______

٣


______ یەکی ______ دەیی = ______

٤


______ یەکی ______ دەیی = ______



**پرسیارێك شیکار دەکەم** ■ **ڕێنوێنی بەدیتن**

ژمارەکە ڕوون دەکەمەوە بەشێوەی جیاواز .





**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە ئەو ژمارەیە بڵێ کە لە ٣ یەکی و ٧ دەیی پێك هاتووە، کردارەکە دووبارە بکەوە لەگەڵ چەند ژمارەیەکی تر .

وانەی ٤ ______________

# ژمارەکان جیادەکەمەوە






٥ یەکی ٩ دەیی = ٩٥

٥ + ٩٠

ڕەنووسی یەکان و ڕەنووسی دەیان دەنووسم
ژمارەکە بە ڕێگەیەکی جیاواز دەنووسم.

**١**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**٢**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**٣**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**٤**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**باسبکە** ■ **ڕێنوێنی**

ڕەنووسی ٨ چی دەنوێنێ لە هەریەکە لەو دوو ژمارەیەدا .

و بەکاردەهێنم بۆ ڕوونکردنەوەی وەڵامەکە .



# ڕاهێنان دەکەم



ڕەنووسی یەکان و ڕەنووسی دەیان دەنووسم
ژمارەکە بە ڕێگەیەکی جیاواز دەنووسم.

**١**



٨ یەکی ٨ دەیی = ٨٨

٨ + ٨٠

**٢**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**٣**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**٤**



______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**پرسیارێك شیكار دەكەم ▪ ڕێنوێنی**

▬ و ▪ بەکاردەهێنم بۆ شیکار

**٥** هیوا ٣٧ شریتی پێوە نوساوی لایە هەر دە وێنەی لەم شریتە نوساند بە پەڕەی دەفتەرەکەی.

چەند پەڕەی پڕکردۆتەوە ؟ ______ لاپەڕە

چەند شریتی لا ماوە ؟ ______ شریت

**چالاکی ماڵەوە •** ژمارەیەك بە منداڵەكەت لە نێوان ١٠ و ١٠٠ بدە، داوای لێبكە ڕەنووسی یەكان و دەیان بنووسێت پاشان داوای لێبكە بینوسێتەوە لە شێوەی كۆ بۆ نموونە : ٣٤ بریتییەلە ٤ یەكی و ٣ دەیی ئەویش بریتییە لە (٤ + ٣٠ ).

# پرسیارێك شیكار دەكەم
## دەخەملێنم

وانەی ٥ ________

تێ دەگەم | پلان دادەنێم | شیكاردەكەم | ساغدەكەمەوە

چەند كتێب لەتواناتدایە هەڵبگریت.




نزیكەی ٥ 

نزیكەی ٥٠ 

خەملاندنی گونجاو دەور دەدەم.

١ چەند (کورسی) لە ژووری پۆلدایە ؟

نزیكەی ٣ (کورسی) نزیكەی ٣٠ (کورسی)

٢ دەتوانیت (کیوب) چەند بەیەك دەست هەڵبگری ؟

نزیكەی ٥ (کیوب) نزیكەی ٥٠ (کیوب)

٣ چەند (گیرە)بچووك لە تواناتدایە بە یەك دەست هەڵبگری ؟

نزیكەی ١٠ (گیرە) نزیكەی ٤٠ (گیرە)

٤ چەند (مۆز) لە تواناتدایە لە دەفرێك دابنێیت؟

نزیكەی ٥ (مۆز) نزیكەی ٥٠ (مۆز)



# ڕاهێنان دەکەم

خەملاندنی گونجاو دەور دەدەم.

١ چەند 🍎 لە توانادایە لەسەر سینیەك هەڵبگری ؟

نزیکەی ١٠ — نزیکەی ٨٠

٢ چەند ✏️ لە توانادایە بەیەك دەست هەڵبگری ؟

نزیکەی ١٠ — نزیکەی ٧٠

٣ چەند 👟 لە ژووری پۆلدایە ؟

نزیکەی ١٠ — نزیکەی ٦٠

٤ چەند ● پێویستە بۆ داپۆشینی لاپەڕەیەکی کتێبەکەت؟

نزیکەی ١٠ — نزیکەی ٩٠

٥ چەند لە کاغەزی کتێب پێویستە بۆ داپۆشینی مێزەکەت لە پۆلدا ؟

نزیکەی ٨ — نزیکەی ٨٠

٦ چەند 🍬 لە توانادایە بە دەستێك هەڵبگری ؟

نزیکەی ١٠ — نزیکەی ٤٠





**بنووسە**

پرسیارێك دروست بکە پاشان داوا لە هەڤاڵەکەت بکە خەملاندنی گونجاو هەڵبژێری .

**چالاکی ماڵەوە** • داوا لە منداڵەکەت بکە بخەملێنێت چەند هەڵماتی شوشەیی دەتوانێ بە یەك دەست هەڵبگرێ، نزیکەی ١٠ یان نزیکەی ٩٠ هەڵمات، داوای لێبکە ئەوە ساغبکاتەوە.

# پێداچوونەوەی
## بەشی ٧

ناو ______________

ڕەنووسی دەیان دەنووسم. ژمارەکە دەنووسم

١

______ دەیی = ______

٢

______ دەیی = ______

ڕەنووسی یەکەکان و ڕەنووسی دەیەکان دەنووسم. ژمارەکە دەنووسم.

٣

______ یەکی ______ دەیی = ______

٤

______ یەکی ______ دەیی = ______

ڕەنووسی یەکەکان و ڕەنووسی دەیەکان دەنووسم، ژمارەکە بە ڕێگەیەکی جیاواز دەنووسم.

٥

______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

٦

______ یەکی ______ دەیی = ______

______ + ______

**پرسیارێك شیكار دەكەم.**

خەملاندنی گونجاو دەور دەدەم.

٧ چەند ■ لە تواناتدایە لە کوپێکدا دابنێت؟

■ نزیکەی ١٠     ■ نزیکەی ٩٠



## ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## بەشی ٧

ناو ____________________

وەڵامی گونجاو هەڵدەبژێرم.

**١** ئەم وێنەیە چی پیشاندەدات؟



- ٦ دەیی ○
- ٤ دەیی ○
- ٥ دەیی ○
- ٧ دەیی ○

**٢** کام ژمارە ئەم وێنەیە دەردەخات؟



- ٧٠ ○
- ٧٦ ○
- ٧٧ ○
- ٦٧ ○

**٣** کام نووسین ٤ یەکی و ٨ دەیی دەنوێنێ ؟

- ٠ + ٨٠ ○
- ٤٠ + ٨٠ ○
- ٤٠ + ٨ ○
- ٤ + ٨٠ ○

**٤** چەند کەس بەیەکەوە ئەتوانن سواری ئۆتومبیلێکی تایبەتی بن ؟

- نزیکەی ٤ ○
- نزیکەی ١٤ ○
- نزیکەی ٤٠ ○
- نزیکەی ٩٠ ○

**٥** ژمارەیەك دەنووسم یەکان ودەیانی تێدابێت



☐

و بەکار دەهێنم

بۆ نواندنی ئەو ژمارە یە.

بەشی ٨

# بەراوردکردنی ژمارەکان و ڕیزکردنیان







# نامەیەك بۆ كەسوكار

كەسوكاری بەڕێز

ئەمڕۆ دەست بە بەشی ٨ دەكەین. تێدا فێردەبین چۆن بەراوردی ژمارەكان لە میانەی ٩٩ بكەین وە چۆنیەتی ڕیزكردنیان. و ژمارە ڕیزبەندییەكان وبەكارهێنانیان فێردەبین. ئەم لاپەڕەیە زاراوەی بیركاری نوێ و چالاكی لە خۆ دەگرێت پێكەوە لە ماڵەوە پێی هەڵدەستین.

لەگەڵ ڕێزدا..

**زاراوە نوێیەكانم**

بچووكترە لە
یەكسانەبە
نێوان
پێش
گەورەترەلە
پاش

## زاراوەكان

٢٤ > ٢٦

٢٤ **بچووكترە لە** ٢٦

٢٦ > ٢٤

٢٦ **گەورەترە لە** ٢٤

٢٤ = ٢٤

٢٤ **یەكسانە بە** ٢٤




٢٤ دەكەوێتە **پێش** ٢٥ لە سەر هێڵی ژمارەكان

٢٥ دەكەوێتە **نێوان** ٢٤ و ٢٦

٢٦ دەكەوێتە **پاش** ٢٥

## چالاكی

لەسەر پارچە كاغەزی بچووك ژمارەكان لە ٥٠ تا ٦٠ و هێماكانی > ، < ، = بەجیا بنووسە، ئەو پارچە كاغەزانەی ژمارەكانی لەسەرە هەڵیان دەگێڕمەوە وتێكەڵیان دەكەم بۆ ئەوەی ئەو ژمارانەی لەسەریانە دەرنەكەون. داوا لە منداڵەكەت بكە دووپارچە هەڵبژێرێ لە پارچەكان بیكاتەوە و بۆ دەركەوتنی دوو ژمارەی نوسراو لە سەریان، پاشان داوای لێبكە ئەو كاغەزی هێمای گونجاوی لەسەرە لە نێوانیان دابنێ.

# وانەی ١ ــــــــــــ گەورەترە لە >، بچووکترە لە <

کامیان گەورەترە (٤٣ یان ٤٧)؟ کامیان بچووکترە؟










٤٣ بچووکترە لە ٤٧

٤٣ < ٤٧

٤٧ گەورەترەلە ٤٣

٤٧ > ٤٣

ــــ و ▪ بەکار دەهێنم بۆ نواندنی ژمارەکان ژمارە گەورەکە دەور دەدەم، پاشان ژمارەکان لە شوێنی گونجاو دەنووسم.

**١**







٥٣ گەورەترە لە ٣٥

٥٣ > ٣٥

**٢**







ــــــ گەورەترە لە ــــــ

ــــــ > ــــــ

ژمارە بچووکەکە دەور دەدەم پاشان ژمارەکان لە شوێنی گونجاو دەنووسم.

**٣**







ــــــ بچووکترە لە ــــــ

ــــــ < ــــــ

**٤**







ــــــ بچووکترە لە ــــــ

ــــــ < ــــــ

**باسبکە** ▪ **ڕێنوێنی**

بۆ ئەوەی ژمارە گەورەکە دیاری بکەیت ،ئایا بەراورد لە نێوان دەیان دەکەی یەکەم جار یان لەنێوان یەکان؟

